عەقیدەی

# العباس بن موسى بن مشكويه الهمذاني



وەرگێڕانی :

الشاب السني

١٤٤٥ هـ

## ناساندنی خاوەنی بیروباوەڕ :

ابن أبي يعلى لە **(طبقات الحنابلة ١٦٤/٢)** باسی كردووە .

## سەرچاوەی بیروباوەڕ :

ئەم بیروباوەڕە لە كتێبی **(الإبانة الكبرى)** ی ابن بطة هاتووە .

ابن بطة رحمه الله لە (الإبانة الكبرى) ئەڵێ :

## دەروازەی چاوپێکەوتنی العباس بن موسى بن مشكويه الهمذاني بە ئامادەیی الواثق

أبو عمر عبيدالله بن محمد بن عبيد بن مسبح العطار هەواڵی پێداین و وتی: أبو بكر القاسم بن إبراهيم الصفار القنطري هەواڵی پێداین وتی: سلامة بن جعفر الرملي هەواڵی پێداین و وتی: العباس بن مشكويه الهمذاني هەواڵی پێداین و وتی:

١ - من و کۆمەڵێک لە زانایان چووینە لای خەلیفەی ناوبراو بە الواثق، لەنێوانیاندا ڕووی تێکردم بە پرسیارێک .

وتم : ئەی پێشەوای ئیمانداران من پیاوێکم ئەترسم، وە هیچ ئەزموونێکم نییە لە قسەکردن لەگەڵ خەلیفەکانی پێش تۆ .

وتی : مەترسە، هیچ کێشەت نەبێت، چی ئەڵێیت دەربارەی قورئان؟

وتم : کەلامی الله یە و غەیر مەخلوقە .

وتی : شاهێدی ئەدەیت بەوەی مەخلوقە، یان ئەدەم لە گەردنت

وتم : ئەگەر تۆ بدەیت لە گەردنم ئەوە تۆ لەو شوێنەی ئەگەر بێ ئەوە قەدەری الله یە، لەسەرم بوەستە ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئەگەر من زانا

بووم بەڵگەکەم جێگیر ئەکەم، وە ئەگەر نەزانیش بووم واجبە لەسەرت کە فێرم بکەیت چونکە تۆ پێشەوای ئیماندارانیت، وە خەلیفەی الله یت لەسەر زەوی، وە کوڕە مامەی پێغەمبەرەکەییت ﷺ - لە نەوەی ابن عباس ی کوڕە مامی رسول الله ن ﷺ بۆیە پێیان ئەوترێ عەباسیەکان - .

٢ - وتی : ئایا | إِنَّا كُلَّ شَىۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٍ | ت نەتخوێندۆتەوە؟

وە | وَخَلَقَ كُلَّ شَىۡءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرًا | [الفرقان : ٢] .

وتم : ئەی پێشەوای ئیمانداران كُلَّ لە کتێبی الله تایبەتە یان گشتیە؟

وتی : گشتیە

وتم : نەخێر، بەڵکو تایبەتە، الله ئەفەرموێ: | وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَىۡءٍ | [النمل : ٢٣] ئایا موڵکی سلیمان ی پێ درابوو؟

---

: الواثق ی جەهمی ویستوویەتی بەم ئایەتانە بەڵگە بهێنێتەوە کە هەموو شتێک درووستکراوە وە قورئانیش شتە کەواتە قورئانیش داخڵی ئەو هەموو شتە ئەبێت و ئەبێت بە مەخلوق، ئەویش وەڵامی ئەداتەوە کە هەموو كُلَّ یێک لە قورئاندا هاتووە بۆ گشتاندن نیە، چونکە الله تعالى دەربارەی مەلیکەکەی سەبەء ئەفەرمووێ : | وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَىۡءٍ | [النمل : ٢٣] کەچی هەموو شتێکیشی پێ نەدرابوو، بۆ نمونە: پێغەمبەرایەتی و موڵکی سلیمان عليه السلام و نەمری و زانینی غەیب و زۆر شتی تریش .

**٣** - منی لابرد بە گۆچانەکەی کە لەبەر دەستیدا بوو، دواتر وتی: بیکەنە دەرەوە، لە گەردنی بدەن، کردمیانە دەرەوە بۆ لای خێمەیەکی نزیک ئەوێ، شانم لەسەر توند کرد، بانگم کرد: ئەی پێشەوای ئیمانداران تۆ ئەدەیت لە گەردنم، وە من پێشت کەوتم، وەڵامێک ئامادە بکە بۆ ئەم پرسیارە .

وتی : بیکەنە دەرەوە، زەندیق، وە لە تەسکترین زینداندا دای بنێن .

**٤** - بردیانم بۆ شوێنێکی گشتی، ئەوکات من لەگەڵ ابن أبي دؤاد چاوپێکەوتن بکەم لەبەرچاوی خەڵکی لەسەر مەسەلەی خەلقی قورئان، کاتێک سەیری کردم وتی: ئەی خرمي .

وتم : تۆ و ئەوانەشی لەگەڵ تۆن، ئێوە شوێنکەوتە و سەرخەری دەجالن .

---

: خرمي دانەپاڵە بۆلای بابک الخرمي ی زەندیقە کە لە سەردەمی عەباسیەکاندا هێرشی ئەکردە سەر موسوڵمانان و هەموو شتێکی وەکو دەستدرێژی کردنە سەر و کوشتن و زۆر شتی تری حەڵاڵ کردبوو، پاڵ ئەوەی ئەگیرێت بە کوشتنێکی زۆر خراپ لەلایەن خەلیفەی عەباسییەکانەوە ئەکوژرێت، والله أعلم .

**٥** - لە زیندانێکی بەغداد کە ناوی المطبق بوو کۆتیان کردم، هەندێک زانا پارچە پەڕەیەکیان بۆ ناردم کە هانیان ئەدام و ڕاگیراویان ئەکردم لەسەر ئەوەی کە من لەسەریم، خوێندمەوە ئەوەی تیایا بوو، جا ئەوەی تیایا بوو :

عليك بالعلم واهجر كل مبتدع - وكل غاو إلى الأهواء ميال

ولا تميلن يا هذا إلى بدع - يضل أصحابها بالقيل والقال

إن القرآن كلام الله أنزله - ليس القرآن بمخلوق ولا بال

لو أنه كان مخلوقا لصيره - ريب الزمان إلى موت وإبطال

وكيف يبطل ما لا شيء يبطله - أم كيف يبلى كلام الخالق العالي

وهل يضيف كلام الله من أحد - إلى البلى غير ضلال وجهال

فلا تقل بالذي قالوا وإن سفهوا - وأوثقوك بأقياد وأغلال

ألم تر العالم الصبار حيث بلي - بالسوط هل زال عن حال إلى حال

فاصبر على كل ما يأتي الزمان به - فالصبر سرباله من خير سربال

يا صاحب السجن فكر فيم تحسبه - أقاتل هو أم عون لقتال

أم هل أتيت به رأسا لرافضة - يرى الخروج لهم جهلا على الوالي

أم هل أصيب على خمر ومعزفة - يصرف الكأس فيها كل ضلال

ما هكذا هو بل لكنه ورع - عف عفيف عن الأعراض والمال

٦ - وتی : دوای چەند ڕۆژێک ناویان هێنام، وە دەریان هێنام لە زیندان، ڕایانوەستانم لە بەردەمیدا .

وە وتی : ڕەنگە لەسەر ئەو قسە جێگیر بیت کە من لە تۆم بیست؟

وتم : سوێند بە الله ئەی پێشەوای ئیمانداران، من لە شەو و ڕۆژەکانمدا داوام لە پەروەردگارم کردووە کە نەمرێنێت ئیللا لەسەر ئەوە نەبێت کە تۆ لە منت بیست

وتی : ئەتبینم پابەندیت پێوەی - سوریت لەسەری - !

وتم : ئەوە شتێک نیە لە ڕوانگەی نەفسی خۆمەوە وتبێتم، بەڵکو شتێکە کە لەسەری گەشتووم بە زانایان لە مەککە و مەدینە و کوفە و بەصرە و شام و سەنگەرەکانی جیهاد، ئەوانم بینی لەسەر سوننەت و جەماعەت

پێی وتم : سوننەت و جەماعەت چیە؟

وتم : پرسیارم کردووە لە زانایان دەربارەی، هەموویان ئەیانوت : صیفەتی ئیماندار لە ئەهلی سوننە و جەماعە :

٧ - بەندە بە ئیخلاصەوە بڵێ: هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە الله، وە محمد بەندە و نێرداویەتی

٨ - وە دان بنێت بەوەی پێغەمبەران و نێرداوان هێناویانە

٩ - وە بەندە شاهێدی بدات؛ بەوەی لەسەر زمانی دەرەکەوێت، وە دڵیشی لەسەر جێگیر بکات .

١٠ - وە ئیمان بەوەی قەدەر خێر و شەڕی لە الله وەیە، وە بەندە بزانێت ئەوەی توشی ئەبێت نەئەبوو لێی لا بدات، وە ئەوەی لێی لا ئەدات نەئەبوو تووشی ببێت

١١ - وە ئیمان وتە و کردەوەیە، زیاد ئەکات بە گوێڕایەڵی، کەم ئەکات بە سەرپێچی .

١٢ - وە الله عز وجل زانیویەتی درووستکراوەکانی چی ئەکەن، وە بەرەو چی ئەڕۆن، کۆمەڵەیەک لە بەهەشتە و کۆمەڵەیەک لە دۆزەخ .

١٣ - وە نوێژی جومعە و جەژنەکان لە پشتی هەموو پێشەوایەکی چاکەکار و خراپەکار .

---

: ئەهلی سوننە کۆکن لەسەر ئەوەی پێشەوای موسڵمانان چاکەکار بێت یان تاوانبار و ستەمکار مادام موسڵمان بێت ئەوا نوێژی جومعە و جەژنەکانی لە پشتەوە ئەکرێت تا ئەو کاتەی کوفر و شیرکێکی لێ بە دیار ئەکەوێت ئەوکات نوێژەکە دووبارە ئەکرێتەوە، بۆ نمونە: لە پشتی ئەم خەلیفە جەهمیە کە ئەڵێت قورئان مەخلوقە و خەڵکی لەسەر تاقی ئەکاتەوە و خەڵکی پێوە پابەند ئەکات نوێژ ناکرێت، وە نوێژی جومعە و جەژنەکانی لە پشتەوە ئەکرێت و دواتر دووبارە ئەکرێتەوە.

**الإمام أحمد** له **(أصول السنة)** ئەڵێ: نوێژی جومعه له پشتی ئەو و ئەو کەسەی ئەو دایئەنێت درووسته و تەواوە و دوو ڕکاتە، هەرکەس دووبارەی بکاتەوە ئەوە موبتەدیعە وازی هێناوە لە ئاثار پێچەوانەکاری سوننەتە.

**البربهاري** له **(شرح السنة : ١٤٠)** ئەڵێ: ئەگەر پیاوێکت بینی ئامادەبوو لە فەڕزەکان لە جەماعەتدا لەگەڵ سوڵتان و غەیری ئەویش بزانە ئەوە خاوەنی سوننەتە إن شاء الله تعالی، وە ئەگەر بینیت پیاوێک تەمەڵی ئەکات لە فەڕزەکان لە جەماعەت ئەگەر لەگەڵ سوڵتانیش بێ بزانە ئەوە خاوەنی هەوا و ئارەزووە.

**عبدالله بن أحمد** له **(السنة : ٤)** ئەڵێ: گوێم لە باوکم بوو ئەیوت: هەرکەس ئەو قسەیە بکات - واتە هەرکەس بڵێت: قورئان مەخلوقە - نوێژی لە پشتەوە ناکرێت؛ جومعە و غەیری ئەویش، جگە لەوەی ئێمە داوا ناکەین بێن بۆی ئەگەر پیاوێک نوێژی جومعەی لە پشتەوە کرد ئەوا نوێژەکە دووبارە ئەکاتەوە.

**البربهاري** له **(شرح السنة : ١٢٦)** ئەڵێ: ئەگەر پێشەواکەت لە ڕۆژی جومعەدا جەهمی بوو وە سوڵتانیش بوو نوێژی لە پشتەوە بکە و نوێژەکە دووبارە بکەرەوە .

## **١٤** - وە نوێژی فەڕزیش بەبێ ئەوەی کاتەکەی پێش بخرێت یان دوا بخرێت

## **١٥** - وە نوێژکردن لەسەر هەرکەسێک کە ئەمرێت لە ئەهلی قیبلە .

---

: ئەهلی قیبلە واتە کەسێک نوێژ بکات .

**١٦** - وە کەس نەخەیتە بەهەشتەوە و ئاگرەوە .

---

: واتە شاهێدی بۆ هیچ موسوڵمانێک بە بەهەشت یان بە ئاگر ئیللا ئەو کەسانە نەبێت کە الله تعالی یان رسول الله ﷺ هەواڵیان داون .

**١٧** - وە شاهێدی ئەدەین بۆ ئەو **١٠** کەسەی کە رسول الله ﷺ شاهێدی بۆ داون لە قورەیش بە بەهەشت

**١٨** - وە خۆشەویستی و ڕق لێبوونەوە لەپێناوی الله .

**١٩** - وە کەوتنی تەڵاق کاتێک بە وشەیەک ڕوو ئەدات .

---

: کەوتنی تەڵاق بە یەک وشە وایە پیاوەکە بڵێت بە هاوسەرەکەی (سێ بە سێ تەڵاقت کەوتێ)، ئەمەش لەلای سەلەف ئیجماعی لەسەرە .

**٢٠** - وە مەسح لەسەر خوف بۆ گەشتیار سێ ڕۆژ، بۆ کەسی دانیشتوو ڕۆژ و شەوێک .

: ڕەددە بۆ خەواریج و ڕافیضەکان چونکە لە بیروباوەڕدا پێوەی ئەناسرێنەوە، وە کەسی سونی پێ جیا ئەکرێتەوە لە کەسی موبتەدیع، المروذي ئەڵێ: گوێم لێبوو بە أبا عبدالله أحمد بن حنبل وترا: کەسانێک هەن وای نابینن مەسح بکرێت، وتی: ئەوانە خەواریجن کەسانێک لە ئیباضیەکان **(المسائل والرسائل ٢/٤٢١)** .

**٢١** - وە کورتکردنەوە - نوێژ - لە سەفەردا کاتێک گەشتی کرد لە **١٦** فەرسەخی هاشمی .

: نزیکەی **١٠٠** کیلۆمەتر ئەکات، هەرچەندە لەسەر مەودای کورتکردنەوە خیلاف هەیە.

**٢٢** - وە پێشخستنی بەربانگ و دواخستنی پارشێو .

: جولەکە و ڕافیضە تا دەرکەوتنی ئەستێرە لە ئاسماندا ڕۆژوو ناشکێنن .

**٢٣** - وە دانانی - دەستی - ڕاست لەسەر چەپ لە نوێژدا

**٢٤** - وە ئاشکراکردنی آمین

## ٢٥ - وە شاردنەوەی بسم الله الرحمن الرحيم .

: هۆکاری باسکردنی ئەم بابەتە لای کۆمەڵێک پێشەوای سوننە لە دەروازەکانی بیروباوەڕ و سوننەتدا ئەوەیە کە **ابن تيمية** لە **(منهاج السنة ٤/١٥٠)** ئەڵێ: لە عێراق وا ناسراو بوو کە ئاشکراکردنی لە شیعاری ڕافیضە بووە.

**سفيان الثوري** بە شعیب بن حرب ئەڵێ: هیچ سوودت پێ ناگەیەنێت ئەوەی نووسیوتە تاوەکو شاردنەوەی بسم الله الرحمن الرحيم لە نوێژدا لەلات باشتر نەبێت لەوەی ئاشکرای بکەیت.

**(شرح أصول اعتقاد اللالكائي)**

**ابن بطة** لە **(الإبانة الصغرى ٣٥٠)** ئەڵێ: وە لە سوننەت ئەوەیە بسم الله الرحمن الرحيم بە ئاشکرا نەڵێیت.

پرسیار ئەکرێت لە **الدارقطني** دەربارەی ئەو فەرموودانەی لەسەر ئاشکراکردنی هاتوون، ئەڵێ: هیچ شتێکیان صەحیح نیە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم.

**(نصب الراية ١/٣٥٨)**

کاتێک پرسیار لە أحمد بن حنبل ئەکرێت لەسەر نوێژکردن لە پشتی کەسێکەوە کە بسم الله الرحمن الرحيم بە ئاشکرا ئەڵێت، ئەڵێت: کێشەی نیە ئەگەر خاوەنی بیدعە نەبوو.

**(مسائل حرب الكرماني لاپەڕە ١٦٩)**

**٢٦** - وە بە زمانت بیڵێیت وە لە دڵیشتەوە بە یەقینەوە بزانیت کە باشترینی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی: أبو بکر ، دواتر عمر ، دواتر عثمان ، دواتر علي  رضوان الله علیهم .

**٢٧** - وە خۆگرتنەوە لەوەی ڕوویداوە لەنێوان هاوەڵانی رسول ﷺ .

**٢٨** - وە ئیمان بە زیندووبوونەوە .

**٢٩** - وە سزای ناوگۆڕ وە منکر و نکیر .

**٣٠** - وە صیراط .

**٣١** - وە تەرازوو .

**٣٢** - وە الله ئەهلی تاوانە گەورەکان لەم ئوممەتە دەرئەهێنێت لە ئاگر، وە کەسی تێدا نامێنێتەوە ئیللا موشریك نەبێت .

**٣٣** - وە ئەهلی بەهەشت الله ئەبینن بە چاوەکانیان .

**٣٤** - وە قورئان کەلامی الله یە غەیر مەخلوقە .

**٣٥** - وە زەوی هەمووی ئەگرێت لە ڕۆژی قیامەت، وە ئاسمانەکان بەدەستی ڕاستی ئەپێچێتەوە، پاك و بێگەردی بۆی لەوەی شیرکی بۆ بڕیار ئەدەن .

ئەڵێ: کاتێک ئەمەی بیست لێم - واتە الواثق - ، فەرمانی لەسەر کردم کە چوار ددانی دواوەم هەڵبکێشرێ .

وە وتی: دووری بخەنەوە لێم، با ئەوەی لەسەریم لێم تێک نەدات .

: واتا با گومانم بۆ درووست نەکات لە بیروباوەڕەکەمدا .

**٣٦** - دەرکرام، گەشتم بە أبا عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل پرسیاری لێکردم دەربارەی ئەوەی لەنێوان من و خەلیفە ڕوویداوە، هەواڵم پێدا .

وتی: الله ئەم هەڵوێستەت لەبیر ناکات کاتێک ئەوەستیت لەبەردەمیدا .

دواتر وتی: پێویستە ئەمە بنووسینەوە لەسەر دەرگای مزگەوتەکانمان، وە ماڵ و منداڵەکانمان فێر بکەین، دواتر لای کردەوە بۆ لای کوڕەکەی صالح، وتی: ئەم گفتوگۆیە بنووسەوە، دایبنێ لە پەڕەیەکی سپیدا، بیپارێزە، بزانە باشترین شتە کە نووسیتبێتەوە، کاتێک گەشتیتەوە بە الله لە ڕۆژی قیامەت پێی گەیشتوویتەتەوە لەسەر سوننەت و جەماعەت .

لینکی عەقیدەکە بە عەرەبی : https://t.me/jami3mutun/29